# ناوەڕۆك


پێشەکی

سەرزەوی چین

خەڵکی چین

کشتوکاڵ

وشکەساڵی و قاتوقوڕی

لێهاتوویەکانی چینی دێرین

- دارڕژتنی حەوت جۆش
- یەشم
- ئاوریشم
- چایی
- چاپ
- دەفری چینی
- زانست
- پزیشکی و دروستکردنی دەرمان

دەوڵەت

- ئیمپراتۆر
- راپەڕین
- فەرمانبەری دەوڵەت

پەروەردەو فێربوون

ئایین

خێزان

ئایینی بنەماڵەیی

شارەکان

زمان

ئەدەب

وێنەکێشان

پەیوەندی چین و جیهان

پوکانەوەی ئیمپراتۆری چین

فەرهەنگ و نوێکاری

شاخ و دەریاکانی چین

## پێشەکی

لەمناميلکه بچوکەدا هەوڵ دەدەین باسێکی کورت لە ژیانی خەڵکی ئیمپراتۆریەتی چین، لە 2000 ساڵ پێش زایینەوە تا ساڵی 1911 بکەین. بە درێژایی ئەم ماوەیە، سەرزەوی چین هەوراز و نشێو و شەر و ئاشتی زۆری بە خۆیەوە بینیوە. بە پێی تێپەڕینی ئەم هەمووە ساڵانە، چین وەکوو یەکێک لە بەهێزترین وڵاتەکان دەرکەوتووە.

## سەرزەوی چین

چین وڵاتێکی گەورەو بەرینە کە خاکەکەی چل ئەوەندەی خاکی بەریتانیایە. بەشێکی زۆری ڕۆژئاوای چین پێکهاتووە لە چیا و بیابان. بەپیتترین ناوچەکانی چین کەوتونەتە ناوچە دەشتاییەکان و دۆڵ و نزیک ڕووبارەکان لە ڕوژهەڵاتی چین. ڕێگە ئاوییەکان ڕۆڵێکی گرنگیان لە مێژووی چیندا گێڕاوە. دۆڵی ڕوباری زەرد ناوەندی ئیمپراتۆرییە سەرەتاییەکانی چین بووە. 18000کم پانتایی ڕوباری" یانگ تسە" بۆ کەشتیوانی کەڵکی لێوەردەگیرا و کەناراوەکانی چینی ناوەندی دەبەستەوە بە زۆرێک لە ناوچەکان. "نۆکەندی گەورە" نزیکەی 1300 ساڵ لەمەوبەر دروستکراوە بۆ ئەوەی چینی ناوەراست بە چینی باکور ببەستێتەوە.

## خەڵکی چین

کەمینە چینییەکان واتە مەغۆڵەکان، تبتییەکان و هەندێک لە نەتەوەکانی دیکە لە دامێن و بەرزی چیاکان خەریکی ماڵداری و کاری کشتوکاڵی بوون. 94% ی ئەو ناوچانە خەڵکی چینن. لە ئێستادا ژمارەی دانیشتوانی چین نزیکەی 1380000000 (یەک ملیارد و سێسەت و هەشتا ملیۆن) دەبێت.

## کشتوکاڵ

وێنەیەك كە كێڵگەیەكی برنج نیشان دەدات

زۆربەی خەڵکی چین گوندنشین بوون و کاری کشتوکاڵیان دەکرد. خۆراکی خەڵکی چینی باکور دانەویڵە بوو و هی چینی ناوەراستیش برنج بوو. سفرەوخوانی دەوڵەمەندان و خەڵکی مامناوەند لە چاو سفرەوخوانی خەڵکی جوتیار ڕازاوەتر بوو. خواردنی وان شۆربایەکی خەست بوو کە لە برنج و سەوزی

دەفرێکی حەوتجۆش تایبەت بە بۆنەی ئایینی کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی شانشینی جو

و گۆشت یان گۆشتی ماسی دروستکرابوو. هەروەها جۆرە ماکارۆنیەکیش (کە لەگەڵ هێکە لێدەندرا)، هاوکات شیرینی و شەرابی زەردیشیان دروست دەکرد. بە هۆی ئاوی زۆر و ناوچەی شێدار، چاندنی برنج زۆر بەربڵاو بوو، هەر لەبۆیە چینییەکان توانیان رێگەی چاتر و باشتر بۆ ئاوەدێری بدۆزنەوە. دروێنە کردنی برنج لەچاو دروێنەی دانەوێڵەکانی دیکە جیاوازی هەبوو. لە دوای وشک بوونەوەی کێڵگەکان، گوڵی برنجەکانیان بە داسێک یان بە جۆرێک چەقۆی دەم خوار دەبڕینەوە و لاسکە براوەکانیان بە کوتان لە گوڵە برنجەکان جیادەکردەوەو بۆ جیاکردنەوەی دەنکە برنجەکان لە شەڵتەکەکەی دەبوایە دەنکەکانیان بە هاوون کوتابا تا پێستی برنجەکە لێی جودا دەبووەوە.

ملوانکەی لە یەشم دروستکراو لە شکڵی ئەژدیها

## وشکەساڵی و قاتوقوڕی

ئاو و هەوای چین زۆر جێی باوەڕ نەبوو، جاری وا هەبوو بە هۆی باران نەبارین بۆ ماوەیەکی زۆر، وشکەساڵی دەستی پێدەکرد کە قاتوقوڕی و برسیەتی بە دوای خۆیدا دەهێنا. جاری واش بوو بە هۆی باران نەبارین زەوییە کشتوکاڵییەکان وشک دەبوون و لەناو دەچوون و هەندێ جاریش لافاو دەهات و وێرانی دەکردن. لە بارودۆخی نائاسایی و وشکەساڵیدا، خاوەن زەوییە گەورەکان واتە دەوڵەمەندەکان پشتیان بە خۆراکە ئەنبارکراوەکان دەبەست یان لە بازار پێویستیەکانی خۆیان بەر لەوەی گران و دەگمەن بن، دەکڕی. ژیانی خۆیان بەم جۆرە رزگار دەکرد، بەڵام خەڵکی هەژار و ماڵوێرانیش کە زەوی بچوکیان هەبوو، بە هۆی ئەو کارەساتانەوە بە یەکجاری خاپوور دەبوون، نەیاندەتوانی پێداویستیەکانی خۆیان دابین بکەن، بۆیە بە هۆی برسێتیەوە لەناو دەچوون.

## لێهاتوویەکانی چینی دێرین

*چینییەکان لە سەرانسەری دونیا بە لێهاتوویی ناسرابوون و چەندین سەدە بەر لە ئەوروپا، دەستیان دابووە داهێنان و شتی نوێ دروستکردن.*

## دارژتنی حەوت جۆش

پیشەوەرانی چینی نزیکەی 3000 ساڵ پێش بە کەڵک وەرگرتن لە هاوجۆشی تواوەی مس وقەلایی و لە قاڵب گرتنی، توانیان دەفر و دۆڵی رازاوە دروستبکەن. ئەوان یەکێکن لە کۆنترین نەتەوەکان کە بە چۆنیەتی دارژتنی حەوت جۆش ئاشنا بوون.

## یەشم

خەڵکی چین هەر لە کۆنەوە دەگەڵ یەشم ئاشنایەتیان هەبووە، کە وەکوو بەردێکی گرانبەها لە لایان نرخی هەبووە. بەردی یەشم لە چین دەگمەن بوو و بۆ بەدەستهێنانی ئەو بەردە گرانبەهایە بۆ ئاسیای ناوەراست و ناوچەکانی دەرەوەی خاکی چین سەفەریان دەکرد. لە داتاشینی ئەم بەردە گرانبەهایە کارزان بوون. لە بۆنە کۆنەکانی چین زۆر سوود لەم بەردە وەردگیرا، بۆنمونە گۆچانەکەی ئیمپراتۆری چین لە یەشم دروستکرابوو و هەتا لە دوای مردنیش هەر سوودیان لەو بەردە وەردەگرت و بە دانانی پەیکەری تاشراو لە بەردی یەشم لە گۆڕی مردووەکان، پێیان وابوو کە ئەم بەردە لە سەفەری دوای مردنیان بۆ جیهانی دیکە دەیانپارێزێ.

# ئاوریشم

کاری دروستکردنی ئاوریشم

بەنی ئاوریشم لە بەرگی کرمی ئاوریشمی واتە ئەو بەرگەی کە کرمی ئاوریشم بۆ خۆشاردنەوە کەڵکی لێوەردەگرێ، بەدەست دێت. 2000 ساڵ پێش بۆ هەوەڵین جار چینییەکان لەگەڵ چۆنیەتی ئەو بەنە ئاوریشمییەی بەرگی کرمەکان ئاشنایەتییان پەیدا کرد. جلوبەرگی دەوڵەمەندەکانی چین و هەتا باوەشێنەکانی دەستیشیان، لە ئاوریشم دروستکرابوو. وێنەکێشانی چینی لەسەر ئاوریشم وێنەیان دەکێشا. بازرگانە چینییەکان بەر لە گرتنەدەستی دسەڵات لە لایەن رومییەکانەوە، پارچەی ئاوریشمیان بە ئەسپ لە "رێگای ئاوریشم"ەوە بۆ تەواوی ئاسیا و بەشێکی ناوچەکانی ئەوروپاش دەگواستەوە.

بەرهەمهێنانی ئاوریشم لە چینی ناوەڕاست لە ناوچەیەک کە داری تووی لێ دەڕوا، سەریهەڵدا.

دوو نمونە لە دەفری چینی

کرمی ئاوریشمی لە داری توو پەیدا دەبێ(لە کاتی گەورەبوونی واتە لە کاتی گۆڕانی لە کرمەوە بۆ پەپولە) بەرگێک بەدەوری خۆیدا دروست دەکات. چینییەکان دەهاتن و ئەم کرمانە کە بەرگێکیان لە دەوری خۆیان ئاڵاندبوو دەخستنە ناو ئاوی گەرم، دوای مردنی کرمەکان و نەرم

بوونیان ئەو بەرگە کە وەک گرێ وابوو دەکرانەوەو دواتر بە هۆی رستنی، بۆ دروست کردنی پارچە سوودی لێوەردەگیرا.

پیشەوەرە لێهاتووەکانی چین ئەو گرێ ئاوریشمیانەیان بە ماددەیەکی رەنگی کە لە گیای "نیل" بەدەست دەهات، رەنگیان لە ئاوریشمەکە دەدا و بە ئامرازی دەستی چنین، ئەو گرێ رەنگیانەیان دەکردە پارچەی سادە و هەندێک جاریش پارچەی رازاوەتریان لێ دروست دەکرد.

## چایی

رووەکی چایی لە داوێنی چیاکانی چینی ناوەڕاست دەڕوا. خەڵکی چین ئەوەڵین کەسەکان بوون کە لە داری وشکی چایی بۆ دروستکردنی چایی بۆ خواردنەوە کەڵکیان وەرگرت. چەند سەت ساڵ دواتر بوو کە ئەورپاییەکان لە چینیەکانەوە فێر بوون. چینییەکان چاییان لە کەتری بچوکدا دێم دەکرد و بەپێچەوانەی ئەوروپییەکان، ئەوان بە بێ شەکر و شیر دەیانخواردەوە.

## چاپ

لە چین کاغەز لە (حەیزەران) دروستدەکرا. 600 ساڵ بەر لە داهێنانی چاپ لە ئەوروپا، جۆرە چاپێکی سادە لە چین کەڵکی لێ وەردەگیرا. دوو سەدە دوای داهێنانی چاپی باسمەیی ئەم جۆرە چاپە کامڵ بوو و پیت و نیشانەکانیش دوست بوون کە دەیانتوانی بیانگۆڕن و پێویستی بە هەڵکۆڵینی لاپەرەی داریی نەبوو.

کاتژمێری ماشێنی سوسونگ

## دەفری چینی

چینییەکان نزیکەی هەزار ساڵ لەمەوبەر فێری دروستکردنی دەفری قایم و زەرفی چینی بوون و ئەم جۆرە دەفرانەیان هەناردەی هەموو ئاسیا و ئەوروپا دەکرد. زۆرێک لە نموونەی دێرین و گرانبەهای دەفری چینی لە موزەخانەکان نمایش دەکرێن و بەردەستن. دەفرە چینیە کۆنەکان بە رەنگی کرێمی یان سەوزی کاڵ رەنگدەکران. دواتر لە سەدەی چواردە بەدواوەوە دەفری چینی رەنگی سپی و ئاویی و رەنگی دیکەشی بەخۆو گرت. باوترینی ئەم دەفرانە کە دەکرێ ئاماژەیان بۆ بکرێ بریتی بوون لە گوڵدان، قۆری، فنجانی چایی، جامی شەراب و قاپی تایبەتی بۆ برنج. نەخشی سەر دەفرەکانیش وێنەی گوڵ، باڵندە، ئەژدیها، ماسی و هەندێک جاریش مەنزەرەی سروشت بوون.

## زانست

زانا وهونەرمەندە چینییەکان (چەندین سەدە پێشتر) زۆرێ لە ئامرازی ئاڵۆزی زانستیان دروستکرد. ئامرازی پێوەری بومەلەرزە هەوەڵین جار لە ساڵی 132ز لە چین دروستکرا. ئامرازی پێوەری بومەلەرزەی چینی بریتی بوو لە دەستگایەک کە لە چوار لای سەرکییەوە چوار ئاونگی پێوە بوو کە بە کۆتایی هەر ئاونگێکیش گولەیەکی فلزی پێوە بوو. لەژێر هەر ئاونگێکەوە پەیکەری گیاندارێکی بۆق ئاسا کە زاری کردبووەوە داندرابوو، کە لەگەڵ روودانی بومەلەرزە، گولەکەی کۆتایی ئاونگەکە رەها دەبوو و دەکەوتە ناو زاری گیاندارەکە. بە جۆرێک بوو کە لە هەر لایەکەوە بومەلەرزە پەیدا بوایە، گولەکە دەکەوتە ئەو لایەیان. بەم پێوەرە ئاراستەی روودای بومەلەرزەکە دیاری دەکرا.

چینییەکان هەوەڵین نەتەوە بوون کە بە شێوازی جۆراوجۆر لە جیاتی هێزی مرۆیی سوودیان لە هیزی ئاو وەرگرت. ئاوپەڕە ئامرازێک بوو کە بە هێزی ئاو دەجوڵا و بۆ کوتانی برنج و جوداکردنەوەی چەڵتوکەکەی کەڵکی لێوەردەگیرا. جۆرێک دەمە ئاسنیش دروستدەکرا کە بە

هێزی ئاو دەکرایەوە و دادەخرا. لە ساڵی 1088ز سۆسۆنگ کاتژمێرێکی گەورەی دروستکرد کە بە هێزی ئاو کاری دەکرد.

## پزیشکی و دروستکردنی دەرمان

پزیشکی لای چینییەکان تایبەتمەندی خۆی هەبوو. چینیەکان لە کەڵک وەرگرتن لە رووەک، گیانلەبەر و ماددەی کانزایی حەب و رۆن (دەرمان)یان دروستدەکرد. جۆرێکی دیکەی پزیشکی لە چین، پزیشکی دەرزی ئاژن بوو. هەر پزیشکێک بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشەکان لە رێگای دەرزی ئاژنین، خشتەیەکی تایبەتی هەبوو کە تێیدا هەموو خاڵە هەستیارکانی ئادەمیزادی تێدا دیاریکرابوو، کە لە کاتی چارەسەر، پزیشک دەرزیەکی لەو خاڵانەدا دەبردە ناو لەشی مرۆڤ کە پەیوەندی لەگەڵ نەخۆشیەکەی هەبوو. پزیشک لەم رێگەیەو بە بردنە ناوەوەی دەرزیەکەو سوڕاندنی، مەودای نێوان بەشە هەستیارەکانی کۆنترۆڵ دەکرد و هەندێک لە نەخۆشیەکانی چارەسەر دەکرد. ئەم جۆرە چارەسەرە هێشتا لە چین برەوی هەیە.

# دەوڵەت

## ئیمپراتۆر

تا ساڵی 1911 چین ئیمپراتۆریی بوو. ئیمپراتۆرەکان کە هەریکەوە لە دوای ئەوی تر حوکمرانی چینیان دەکرد و لە یەک خێزانیش بوون، بەم جۆرە زنجیرەی فەرمانڕەوایی جیاوازیان پێکهێنا. لە کۆتایی ئەم نامیلکەیەدا ناوی گرنگترین ئیمپراتۆرەکان باس کراوە. لە چین، ئیمپراتۆر وەکوو کوڕی ئاسمان دەبینرا. لە کتێبە کۆنەکانی مێژووی چین دەڵێن کە ئیمپراتۆر لە لایەن ئاسمانەوە نێردراوە بۆ ئەوەی فرمانڕەوایی بکات. ( هەمیشە هەر بەم جۆر بووە کە ئیمپراتۆرەکان و پاشاکان خۆیان وەکوو نوێنەری خودا زانیوە بۆ ئەوەی بتوانن رێگر بن لە شۆڕش و ڕاپەرینی خەڵک کە

گروپێك لە فەرمانبەرانی دەرباری مینگ

لەگەڵیان کۆک نەبوونە.) لە چین دیانگوت تا ئەو کاتەی ئیمپراتۆر بە ژیرانە فەرامانرەوایی خەڵکی بکات، پەیامی ئاسمانی پاراستووە و کاتێک ئاسمان رووی لێوەرگەڕاند، دەسەڵات ئاڵوگۆڕی پێدەکرێ. فیلسوفە چینییەکان لەوانە کۆنفۆسیۆس (551 تا 479 پ.ز) و منیسۆس (373 تا 289پ.ز) باسیان لە چۆنیەتی فەرمانڕەوایەتی فەرمانڕەواکان کردووە.

لەناو ئەم جۆرە حکومەتانەدا، ئیمپراتۆر تاکە فەرامانڕەوا بوو و فەرمانەکانی ئەو لەلایەن کاربەرێکەرانی ئیمپراتۆرەوە جێبەجێ دەکران. ئیدی خەبەر لە پەرلەمان و مەجلیسێک بۆ تاوتوێکردنی فەرمانەکان نەبوو. ئیمپراتۆری چین خاوەن هێز و سەروەتێکی زۆر بوو کە لەگەڵ خێزانەکەی لە کۆشکێکی گەورە دەژیان، کە مەسئول و خزمەتکار و پاسەوان دەوریان دابوون. هەرکەس لێیان نزیک بوباوە دەبوایە سەری ڕێزیان بۆ دانەواندبان یان سوجدەیان بۆ بردبان.

قوتابخانەی چینی 1850

## راپەڕین

لە کاتی سەرهەڵدانی گەندەڵی و قاتوقوڕی، خەڵک دەستیان دەکرد بە راپەرین و جەنگی ناوخۆ دەستی پێدەکرد، خەڵکیش دەیانگوت کە بە هۆی خراپی فەرمانڕەوایی، ئیمپراتۆر پەیامی ئاسمانی لە دەستداوە، بۆیە خەڵکی دەیانهەوێ سەرکەشی بکەن. لەناو مێژووی چین راپەرینی لەم جۆرە زۆر دەبینرێ کە جوتیارەکان لە ڕێبەرایەتی کەسانێک دژ بە ئیمپراتۆر شۆڕشیان دەکرد و هەندێ جار ئیمپراتۆریان لادەبرد و شانشینێکی دیکە دەستی پێدەکرد، بەڵام ئەم شۆڕشانە هەمیشە سەرکەوتوو نەدەبوون. هەندێ جار لە دوای شکست هێنانیان، جوتیارانێکی زۆر دەکوژران.

## فەرمانبەرانی دەوڵەت

پەیکەری بودا لە یونگ گانگ

فەرمانبەران، خزمەتکاران و کەسانێکی دیکە هەبوون کە لە فەرمانڕەوایی بەسەر خەڵکانی دیکەوە هاوکاری ئیمپراتۆریان دەکرد. ناوەندی فەرمانڕەوایی لە پایتەخت بوو، شەش وەزیری ئیمپراتۆر بەسەر فەرمانبەرەکان، بۆنەکان، بواری دارایی، جەنگ، دادگا و خزمتگوزاری رادەگەیشتن. سەرزەوی چین بۆ ژمارەیەکی زۆر پارێزگا دابەش کرابوو، کە هەر پارێزگایەی فەرماندارێک بەڕیوەی دەبرد. پارێزگاکانیش بۆ ویلایەت و قەزا دابەش کرابوون، کە لە لایان والی و بەرێوەبەرکانەوە ئیدارە دەکران. کاری فەرمانبەران کۆکردنەوەی سەرانە و پاراستنی ئاسایش و جێ بەجێکردنی یاسا بوو.

پەیکەرێکی بچوکی گوان یوئی، خواوەندی رەحمەت

فەرمانبەرانی حکومەت لە رێگەی تاقیکردنەوەوە هەڵدەبژێردران. بەشداری کردن لەم تاقیکردنەوانەش بۆ هەموان ئازاد بوو، بەڵام هەمیشە کەسانی چینی ناوەڕاست یان کەسانی پەیوەست بەو خێزانانەی کە خاوەن زەوی وزاری زۆر بوون دەیانتوانی خەرجی و پێداویستی درێژخایەنی ئەم تاقیکردنەوە و فێربوونانە دابین بکەن. خوێندەوارانی چینی ناوەڕاست لەو سەردەمەدا، رێزی زۆریان لێدەگیرا. کاری زۆرێک لەم نەجیبزادانە وەکوو کاری فەرمانبەران سەخت نەبوو. ئەوان زیاتر سەرقاڵی نوسینی شێعر و سرود بوون. "بوجو-ئی" (722 تا 846 ز) فەرمانبەری حکومەت و نەجیبزادە و شاعیرێکی نێودێر بوو. زۆرێک لە نامەکان کە بۆ دۆستانی ناردووە، لە شێوەی شێعر

نوسراونەتەوە. لە نامەکانی کە بە شێوەی هەڵبەست نوسراونەتەوە، باس لە سەرکەوتنی لە تاقیکردنەوەی دامەزراندن، سەفەر بۆ بەدەستهێنانی پۆستی نوێ، کاری سەختی دیوەخان و هەتا باسی ئەوەش دەکات کە حکومەت ڕێگەی پێ نەداوە لەگەڵ هاورێکانی شەراب بخواتەوە.

## پەروەردەو فێربوون

بنەچەنامەی هەموو ئەم کەسانە بەشێك لە خێزانێك پێك دەهێنن جگە لەو کچانەی دوای هاوسەرگیری لە بنەماڵەی باوکی جیا دەبنەوە . هەر کوڕێك هاوسەرەکەی خۆی دهێنایە ماڵی دایك و باوکی و منداڵەکانیشی هەر لەوێ گەورە دەبوون

کوڕانی خێزانە تێگەیشتوەکان لەناو ماڵەکانی خۆیان مامۆستای تایبەتییان هەبوو. مامۆستا کەسێک بوو کە ڕێزی تایبەتی لێدەندرا و دەبوایە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بووبان. قوتابیانی کوڕ هەوڵیان دەدا وانەکان لە ڕێگای لەبەرکردنەوە فێر ببن. دوای ئەوەی بابەتەکانیان لەبەر دەکرد ئەوجار مانای وشەکانیان بۆ لێکدەدانەوە. بە هۆی لەڕوو نووسینەوە فێری نیشانە و پیتەکان دەبوون، بۆ نووسینیش کەڵکیان لە قەڵەمی پەڕ وەردەگرت. ئەوانەی لە رووی زەینیەوە لەپێشتر بوون، بانگهێشت دەکران بۆ بەشداری کردن لە تاقیکردنەوەکانی حکومی.

وێنەی ئەو خانوە بچوکانەی لە ناو گۆڕاکاندا دۆزراونەتەوە

ڕۆحی پاسەوان کە لە گۆڕدا دۆزراوەتەوە

له کاتی دەستپێکی تاقیکردنەوەکانی ئاستی باڵا، خوێندکارەکان لە بەندێکی تەختەدا زیندانی دەکران، هاوکات بەشە خۆراک و پێداویستی نووسینیشیان پێدەدان. بەو جۆرە تا ماوەیەک لە بەندا دەبوون بۆ ئەوەی نامیلکە و شیعرەکانی کۆنفۆسیۆس و شاگردەگانی لەسەر بنەمای ئەو کتێبانەی کە لەبەریان کردبوون، بنووسنەوە. ئەوانەی کە لەم تاقیکردنەوانە بەسەرکەوتووی دەهاتنە دەرەوە ئەوا لە کاری حکومەتی و لە دیوانی ئیمپراتۆر دادەمەزران. زۆرێکیش لە بەشداربووان دوای چەندین جار تاقیکردنەوە نەیاندەتوانی سەرکەوتوو بن، بۆیە ژیانی خۆیان وەکوو مامۆستا یان کارمەند لە پلەی "دون" لە لادێکان دەگوزەراند. هەندێکیشیان دەچوونە پاڵ نەیارانی ئیمپراتۆر و دەستیان دەکرد بە شۆڕش لە دژی ئیمپراتۆر و هەر ئەوانیش ئەو شۆڕشانەیان بەڕێوەدەبرد. ئەو زمانەی کە خوێندەوارەکان بۆ نووسین بەکاریان دەهێنا، زمانێکی ئەدەبی تایبەت بوو کە خەڵکی ئاسایی نەیاندەتوانی لێی تێبگەن. ئەم کارەو سەختی فێربوونی پیتە چینیەکان و نووسینە چینییەکان ببووە هۆی ئەوەی خ خوێندەوارەکان چینێکی جودا لە کۆمەڵەی جوتیارەکان و کرێکارەکان کە نووسین و خوێندنەوەیان نەدەزانی، بە ناوی "چینی خوێندەوار" بهێننە ئاراوە.

گای فینگ لە سەرەتای سەدەی دوازدە

## ئایین

لە وڵاتی چین ئایینی جیاواز هەبوو و ئایینی بنەماڵەیش یەکێک لە دینە تایبەتەکانی ئەو وڵاتە بوو کە هەر بنەماڵەیەک باوک وباپیرانی خۆیان دەپەرەست. بنەماڵە چینیەکان خودایانی جیاوازیان دەپەرەست، لەوانە خودای ناوچەیی باران و خودای چیشتخانە و زۆربەی جاران بە هۆی ئەوەی کە پێیان وابوو دەرمانێک هەیە بۆ ژیانی هەتا هەتایی، دەچون و لەگەڵ موریدانی ئایینی "تاویزم" راوێژیان دەکرد و ڕێزیان لێ دەگرتن. ( لە ئەفسانە چینیەکان و لە ناو قسەو باسی خەڵکیدا موریدانی تاویزمی بەوە مەشهورن کە نهێنی دروستکردنی ئاوی ژیان دەزانن، ئاوێک کە بۆ ژیانی هەتا هەتایی دەبێت.)

ئایینی بودایی نزیک بە 2000 ساڵ پێش لە هیندەو هاتە وڵاتی چین. دواتر ئایینی بودایی لە چین برەوی پێدرا. زیارەتکارانی چینی روویان دەکرد هیند بۆ ئەوەی دەستیان بە بەرهەم و کتێبە پیرۆزەکانی بودایی رابگات. لە چین خەرجییەکی زۆر بۆ پەرەستگا و مورید و تەرکەدونیایەکانی بودایی دەکرا. لە ساڵی 843ز ئیمپراتۆری تاویزمی چین دەستی کرد بە تاڵان کردنی پەرەستگاکان و زۆرێک لە شوێنە پیرۆزەکانی وێران کردن و پەیڕەوانی ئەو دینەشی ئەزیت و ئازار دەدا، بەڵام بوداییەکانی چین لە ناو نەچوون و هیشتا ئەو دینە لە چین شوێنکەوتوانی زۆری هەیە.

# خێزان

هەر وەکوو کۆمەڵگا دێرینەکانی دیکە، خێزان لە چین یەکێک لە گرنگترین بنیاتەکان بوو و هەمیشە خێزان ئەو دامەزراوە بووە کە تاکەکان دەبوایە ڕێزیان لێ گرتبایە. " کۆنفۆسیۆس" و "مێنسیوس" لەوانە بوون کە زۆر لە بارەی ئەرکی منداڵ بەرامبەر دایک و باوک سەختگیر بوون.

لە چین پیرەپیاوی بنەماڵە، گەورەی ئەو خێزانە بوو. هەموو کەس دەبوایە گوێڕایەڵی گەورەی خێزان و باپیر یان باوک بێت، و کوڕی گەورەی ماڵ بەرپرسیارییەتی تایبەتی هەبوو. بۆ ئەوەی بوبا بە جێنشینی باوک دەبوایە ئەرکە دینییەکانی بە دروستی بە جێهێنابا. گەورەی بنەماڵە دەیتوانی لە بارەی هاوسەرگیری خوشک و براکانی و هەر یەک لە منداڵەکانی بنەماڵە کە چی کارێک دەکەن، بڕیار بدات. ئەگەر هاوسەری یەکەم توانای منداڵ بوونی نەبوایە ئەوا پیاو بۆی هەبوو ژنێکی دیکە بهێنێت یان ئەوەی منداڵیکی کوڕ بە منداڵی خۆی قەبوڵ بکات. هەندێ لە دەوڵەمەندەکان چەندین ژنیان هەبوو و هەریەک لە ژنەکانیش خزمەتکاری خۆیان هەبوو. کچەکانیان بە جۆرێک پەروەردە دەکرد کە بە ئاسانی گوێڕایەڵێ باوک و براکانیان بن. دوای ئەوەی کە کچ هاوسەرگیری دەکرد دەچووە ماڵە مێردی و لەگەڵ بنەماڵەی مێردەکەی ژیانی بەسەر دەبرد. جاری وا بوو خەسوو بە باشی ڕەفتاری لەگەڵ نەدەکرد. تەنیا دوای ئەوەی کە کوڕێکی دەهێنایە دونیاوە، بنەماڵەی مێردەکەی ڕێزیان لێ دەگرت. ژنانی بنەماڵە دەوڵەمەندەکان ئازادییەکی زۆرتریان لە ماڵەوە هەبوو لە چاو بنەماڵە دەست کورتەکان. لە کاتی هاتنە دەرەوەیان لە ماڵەوە سودیان لە عارەبانەی سەرداپۆشراو وەردەگرت کە چەند خزمەتکاریک هەڵیان دەگرت. کاری ژنە دەوڵەمەندەکان، خزمەتکارەکانیان ئەنجامیان دەدا، بەڵام ژنانی بنەماڵە هەژارەکان هەموو کارەکانی ماڵەوەیان بۆخۆیان ئەنجام دەدا و هەروەها لە کاری کێڵگەش یارمەتی مێردەکانیان دەدا.

## ئایینی بنەماڵەیی

زۆربەی خەڵکی چین باوباپیرانی خۆیان دەپەرەست کە مردبوون. مردووەکان پێگەیەکی گرنگیان لە لای چینییەکان هەبوو. ئەوان لەو باوەڕەدا بوون کە لە دوای مەرگ، مردووەکان بەرەو جیهانی ڕۆحەکان کۆچ دەکەن و لەبەر هەندێ لە دوای مردنی هەر کەسێک، کەل و پەلی پێویستیان بۆ سەفەر و کۆچەکەی ئامادە دەکرد. لە سەردەمانی قەدیم لە دوای مەرگی هەر کەسێک لە بنەماڵە دەوڵەمەندەکان ژمارەیەکی زۆر خانووی بچوکی لە گڵ دروستکراو، پەیکەری بچوکی لە شکڵی خزمەتکار، پەیکەری پاسەوان و ئاژەڵی ماڵیان بۆ دەخستنە ناو گۆڕەوە بۆ ئەوەی ئەمانە لە سەفەرەکەیدا یارمەتیدەری مردووەکە بدەن. لە سەردەمانی دواتر کاتێک کە ئەوجار مردوکانیان دەسوتاندن، وێنەی خزمەتکار و خانو و ئاژەڵیان لەسەر کاغەز دەکێشایەو و لەگەڵ مردووەکە دەیانسوتاندن. لە ساڵڕۆژی مەرگی مردووەکەدا بخوریان دەسوتاند و خواردنیان بۆ دەکردە خێر. لە تەنیشت ئاگری چێشت لێنانەوە_ کە پێیان وابوو مردوو لەو رۆژەدا دێتەوە سەر زەوی_ بەخێرهاتنیان دەکرد. لە وەرزی بەهاردا کەس و کاری مردوو جێژنیان دەگرت و دەچوونە سەر پاشماوەی سوتاوی مردووەکە و لەوێدا دووبارە پارەی کاغەزیان بۆ دەسوتاند. لە وەرزی پاییزدا جل وبەرگی لە کاغەز دروستکراویان بۆ دەسوتاند بۆ ئەوەی ئەم جلو بەرگانە لە سەرمای زستان بیپارێزێت.

لە هەر ماڵێکدا میحرابێک هەبوو بۆ پەرەستنی باوک وباپیرە مردووەکانیان و تاکەکانی هەر بنەماڵەیەک بە باشی ئەو شوێنەیان دەپاراست و لە هەر بنەماڵەیەکی دەوڵەمەندا ناوی باوباپیرانیان بۆ چەندین پشت دەپارێزران. باوباپیرانی مردوەکانیشیان بە ئەندامی خێزان حساب دەکردن و پێیان وابوو لە بۆنە گرنگەکانی وەکوو لە دایک بوون و هاوسەرگیری و بە خاکسپاردندا بەشداری دەکەن.

## شارەکان

له چینی دێرین شارنشینی پەرەی پێدرا. کاتێک حەوسەد ساڵ پێش مارکۆپۆلۆ سەردانی شاری "هانگ جو" دەکات له گەورەیی و زبەلاحی ئەو شارە سەری سوڕدەمێنێ. وێنەی شاری "گای فەنگ" لەم نامیلکەیە بەشێک له دیمەنەکانی ئەو شارە نیشان دەدات که له سەدەی دوازدەی زایینی پایتەختی چین بووە. گای فینگ له سەدەی دوازده شارێکی پڕ حەشیمەت بوو که ڕێگا ئاوییەکانی ئەو شارە پڕ له تونگە بوون که برنجیان له چینی ناوەڕاستەوە بۆ شاری گای فینگ دەگواستەوە. شەقامەکانی ئەو شارە پڕ له عارەبانە بوو که له گامێشیان دەبەست یاخود عارەبانەی دەستی که پیاوەکان ڕایاندەکێشا. ئەم شارە دوکان و بازار و دەستفرۆش و پیشەوەری زۆری لێ بوو. لەسەر شەقامەکان خواردنی گەرم و خواردنەوەی ساردی لێ دەفرۆشرا. مەیخانەو چایخانەکانی ئەم شارانە هەمیشە پڕ بوون له خەڵک که دەهاتن و لەوێ گوێیان بۆ قسەو باس دەگرت. له سەدەی سێزدەهەم "پێکەن" بوو بە پایتەختی چین. پێکەن له سێ شاری بەیەکەوە بەستراو پێک هاتبوو که کەوتبوونە ناو یەکەوە. ئیمپراتۆر که شەوکەت و عەزیمەتێکی هەبوو له شاری ناوەند یان له شاری قەدەغەکراو که کۆشکەکانی هەموو له زێڕ و مەرمەڕ و باغی گەورە پێکهاتبوو، دەژیا. شاری قەدەغەکراو کەوتبووە ناو شارێکی دیکەوە که شوێنی کارمەندانی حکومی وپاسەوانەکانی کۆشک بوون و ئەم شارەش بۆخۆی له لایەن بازرگانان و دەوڵەمەندەکانەوە دەورە

شکستی چینیەکان له جەنگی ساڵی 1841

درابوو. شاری پێکەن یەکێک لە ناوەندە گرنگەکانی بەرهەم هێنانی ئاوریشم، زێڕ و زیو و یەشم بوو. وێنەکێشەکانی کۆشک بە بەردەوامی سەرقاڵی کێشانەوەی دیمەنەکانی ناو کۆشک بوون.

## زمان

سیستەمی نوسینی چین سیستەمێکی زۆر کۆنە. لەم زمانەدا ئەلفوبێ بوونی نییە و بۆ دەربڕینی وشە لە نیشانەی وشەکان کەڵک وەردەگیرێ. پەیدا بوونی نیشانە زمانیەکان کە بە شێوەی بەرفراوان لە زمانی چینیدا هەن، نمونەیەکی کۆنی "ئێسقانی پێش بینی" دۆزراوەتەوە کە لەسەر ئیسکەکان هەڵکەندرابوون و دەگەڕێتەوە بۆ 1500 ساڵ بەر لە زایین، لەگەڵ زمانی ئەمڕۆی چین بە تەواوی نزیکایەتی هەیە و ئەمەش نیشاندەری دێرینی ئەم زمانەیە. هەموو خوێندەوارەکان بە ئاسانی دەتوانن کتێب و نووسینە چینیەکان بخوێننەوە سەرەڕای جیاوازی لەهجەکانیش. هەر نیشانەیەک لە ڕێگای جوڵەی قەڵەمی موویی تێکەڵ بە جەوهەر پێک دێت و زۆربەی ئەو نیشانانە لە شێوەی مانای وشەکە دەکێشرێت. ئەم جۆرە لە نیشانانە بە نیشانەی وێنەیی ناوبانگیان هەیە. ئەمانەش چەند نمونەیەکن:

人 **ڕێن** بە مانای خەڵک

口 **کاو** بە مانای زار

ئەو نیشانانەی کە مانای زەینی لە خۆدەگرن زۆر جار لە دوو وێنە پێکدێن:

坐 **ذو**: بە مانای دانیشتن و کۆبونەوە یان ئەنجومەن دێت کە وێنەی دوو پیاو لە بەرامبەر یەک لە سەر زەوی دانیشتوون، نیشان دەدات.

明 مینگ: بە مانای درەوشانەوە کە نیشاندەری خۆر و مانگە.

思 **سی**: بە مانای ئەندیشە کە مێشک لە سەرەوە و دڵ لە ژێرەوە نیشان دراو.

له کاتی کێشانەوەی وێنەی وشەکان دەبێ زۆر وریا بن لەوەی کە قەڵەمەکە بە دروستی بجولێ.

ئەم نیشانانە لە سەرەوە بۆ خوارەوەی لاپەرە بە شێوەی ستونی دەنوسرێن و خوێندنەوەشیان لە راستەوە بۆ چەپە وەکوو زمانی کوردی و بە پێچەوانەی زمانی لاتینی.

## ئەدەب

ئەدەبیاتی چینی زۆر دەوڵەمەند و بەرفراوان و بەناوبانگە. نمونەی بەرچاو لەم شیعرانە بۆ زۆرێک لە زمانەکانی جیهان تەرجەمە کراون. شاعیرانی گەورەی چین وەکوو " لی بو"، "دوفو"، "بوجوای"، "لی هوا" و زۆرێک دیکەش لە رێزبەندی گەورە شاعیرانی دونیان. فەیلەسوفانی چینیش هاوکات لەگەڵ فەیلەسوفانی یۆنانی لە سەدەی پێنجەمی بەر لە زایین، خاوەن ئەندیشەو هزر و بەرهەمی ناوازە بوونە. مێژوونوسانی چینی هاوکات لەگەڵ ئیمپراتۆری رۆم خەریک بە نوسینەوەی مێژووی چین بوون.

## وێنەکێشان

خوێندەوارەکان جیا لە کاروباری دیوەخان بە شیعر و وێنەکێشانیشەوە سەرقاڵ بوون و هەندێ جار هاوکات لەگەڵ وێنەکێشان شیعری تایبەت بە وێنەکانیان دەگوت. وێنەکێشانی چینی زۆر بەنێوبانگ بوو و جیاواز لە وێنەکێشانی ئەوروپایەکانیش بوو. چینییەکان لە کاتی وێنەکێشان کەڵکیان لە جەوهەر وەردەگرت و بە قەڵەم و تێکەڵەی جەوهەر لەگەڵ ئاو هەموو جۆرە سێبەرێکی تاریک و روناکیان بۆ تابلۆکانیان دروست دەکرد. وێنەکانی ئەم هونەرمەندانە زۆرجار دورنما و دارودرەخت و ئاژەڵان و باڵندەکان و گوڵ و گوڵستانی لە خۆ دەگرت. زۆرجار بۆ ئەوەی دیمەنەکان جوانتر دەرکەون، وێنەکانیان لەسەر ئاوریشم و کاغەزی روون دەکێشانەوە.

وێنەکێشە چینیەکان لە کێشانەوەی دیمەنەکان، ڕێسا و تەکنیکی تایبەت بە خۆیان هەبوو کە جیاواز لە ئی ئەوروپایەکان بوو. وێنەکێشی چینی دیمەنی دڵخوازی خۆی لە بەرزایەوە بۆ خوارێ دەکێشایەوە و بۆیە لە تابلۆکانی چینی جستەی مرۆڤ بە بەراوەرد لەو شتانەی کە لە چواردەوریەوەن، زۆر بچوکتر دەردەکەوێ و هەندێ جار ئەوەندە بچوکە کە خەریکە نابیندرێت. هەندێ نمونە لە وێنەکانیان بەم جۆرەیە: خوێندەواری گۆشەگیر، خانویەکی بچوک لەکەنار دەریاچەیەکی گەورە، یەک یان دوو پیاوی ماسی گیر، ڕێگاوبان.

## پەیوەندی چین و جیهان

چەندین سەدە وڵاتی چین لە زلهێزەکانی ئاسیای رۆژهەڵات بوو. خەڵکانی ئەم سەرزەویە هەمیشە شانازیان بە ڕێساو شێوازی ژیانی خۆیان کردووە و خۆیان پێ لە وڵاتە دراوسێیەکانیان لە پێشتر بووە. چینیەکان لە سنورەکانی باکوری وڵاتەکەیان "دیواری چین"یان دروست کردو چەندین سەدە هەر درێژیان کردەوە بۆ ئەوەی لە کۆچی نایاسایی و عەشیرەتە دەشت نشینەکانی باکوور پارێزراو بن، بەڵام ئەو دراوسێیانەی کە پێیاندا هەڵادەگوتن ڕێگەیان پێدرا کە لاسایی پێشکەوتنەکانی چیین بکەنەوەو بەم جۆرە بوو کە زۆرێک لە وڵاتانی دراوسێی چین خەت و شێوازی نوسینی ئەوانیان بەکار هێنا و هۆگری فەلسەفەو ئەدەبیاتی چینیەکان بوون. زیارەتکارانی بودایی کاریگەری گەورەیان لە بەرفرانبوونی شارستانیەتی چین لە ئاسیای رۆژهەڵات هەبووە. چینیەکان چاوەڕوانی ئەوەیان هەبوو کە بێگانەکان شتە باشەکانی چین پەسەند بکەن و بۆ بەدەستهێنانی مۆڵەتی بازرگانیش لەگەڵ چین دەبوایە دیاریان بۆ ئیمپراتۆر رەوانە کردبا و هەروەها سەری ڕێزیشیان بۆ دانەواندبا. لەچاو شێوازەکانی ئەوروپا، چین وڵاتێکی کەنارە بوو و ڕێوشوێنی تایبەت و جیاواز بە خۆی هەبوو بۆ رووکردنە پیشەسازی. لەسەرەتادا، چین پێشوازی لە هەندێ هونەری پیشەسازی ئەوروپایی کرد، بەڵام شۆڕشی پیشەسازی و رووکردنە پیشەسازی قورس و بەرهەمهێنانی کەشتی جەنگی و هێڵی ئاسنیان قەبوڵ نەکرد. ئیمپراتۆرەکانی چین نەیاندەویست خۆیان نیازمەندی رۆژئاوا بکەن و پەیوەندی

لەگەڵ ئەوان ببەستن. لەسەدەی نۆزدەهەم دانیشتوانی چین بە خێرایی رووی لە زیاد بوون کرد و ئەم زیادبوونەش کێشەی زۆری بۆ چینییەکان دروست کرد. میکانیزمی دەوڵەتی چین بۆ پێویستیە نوێیەکان وڵامگۆ نەبوو. ئەوروپایەکانیش ئەوانەی بە دوای مەسڵەحەتی خۆیانەوە بوون، سوودیان لەم دەرفەتە وەرگرت و هێرشیان کردە سەر چین. هزری مۆدێرن کردنی چین زۆر درەنگ دەستی پێکرد.

## پوکانەوەی ئیمپراتۆری چین

کاتێک بازرگانە ئەورپییەکان بۆ یەکەم جار گەیشتنە چین، روبەڕووی ئاستەنگی دژە بێگانەکان بوونەوە، بەڵام لەگەڵ بەهێز بوونی ئەوروپا بارودۆخەکە کەم کەم گۆڕانی بەسەرهات. بازرگانە ئەورپییەکان روبەڕووی ئاستەنگی نوێ بوونەوە: بازرگانە ئەوروپییەکان کە خوازیاری بازرگانی لەگەڵ چین بوون، نەیاندەویست لەبەرامبەر کڕینی چایی، ئاوریشم و دەفری چینی پارەو زێر بدەن! بەڵکو قەسدیان ئەوە بوو لە جیاتی ئەو شتانە، پەموو و تریاک لە هیندستانەوە بۆ چین هەناردە بکەن. کاتێک چین هاوردەی ئەم مادە مەترسیدارە "تریاک"ی رەد کردەوە، جەنگی تریاک دەستی پێکرد و لەگەڵ ناردنی سەربازی بریتانی بۆ جەنگ، چین لە هەوەڵین جەنگی تریاک ( لە 1839-1842) شکستی هێنا. لە راستیدا ئەم جەنگە نەک هەر جەنگی تریاک بوو بەڵکو جەنگی دوو شارستانیەتی کۆن و نوێش بوو. چین گەورەترین وڵاتی شارستانیەتی دێرینی جیهان و بریتانیاش هەوەڵین وڵاتی پیشەسازی نوێ بوو. کێشەکە لەو کاتەوە دەستی پێکرد کە برەوی بازرگانی جیهانی، ئەم دوو وڵاتەی روبەڕوی یەکتر کردەوە و بەریتانیاش لەو جەنگە سەرکەوتنی بەدەست هێنا. هۆکاری سەرکەوتنەکەشی ئەوەبوو کە ئەو وڵاتە خاوەن سیستەم و چەکی پێشکەوتوو بوو. سوپای چین تەنیا بۆ روبەڕووبونەوەی شۆڕشگێڕانی لادێکان و ئەوانەی سنورەکانیان دەبەزاند، راهێنانیان پێکرابوو. هێزە دەریایەکەشی بۆ روبەڕووبونەوەی جەردەی دەریایی راهێنانیان پێکرابوو لەگەڵ کۆنترۆڵ کردنی کەشتیە بازرگانیەکانیش.

ئیمپراتۆری چین له دوای شکستەکەی ناچار بوو کە پەیماننامەی بەریتانیا واژۆ بکات. بە هۆی واژۆی ئەم پەیماننانەیە، بریتانیا و وڵاتانی دیکەی ئەوروپا و ژاپۆن ریگەیان پێدرا لە بەندەرکانی چین کاری بازرگانی بکەن و بۆ سوودی خۆیان هێڵی ئاسنی و رێگاوبان لە چین دروست بکەن. وا دەهاتە بەرچاو کە وڵاتانی ئەوروپایی، دەتوانن وڵاتی چین لە نێوان خۆیان دابەش بکەن، بەڵام بەو جۆرە پێش نەچوو. چینییەکان بەخۆهاتنەوەو ئیمپراتۆریەتی چینیان کۆ کردەوە و حکومەتی کۆماری چینیان راگەیاند و چین رووی لە نوێخوازی کرد. سەرکەوتنی چینیەکان چل ساڵ درێژەی کێشا. بە درێژایی ئەو چل ساڵە جەنگ لەگەڵ داگیرکار و ئیمپریالیستەکان وای لە خەڵک کرد زیاتر هۆشیارتر بن و سەرەنجام هەموویان لە حیزبی کۆمونیستی چین یەکیان گرت. سەرەنجام چین لە ساڵی 1949 گۆڕدرا بۆ وڵاتێکی کۆمونیستی و کەم کەم لە شکڵی وڵاتێکی زلهێزی جیهانی دەرکەوت.

## زنجیرەی ئیمپراتۆریەتی چین

**شانگ** 1600 تا 1027 پ.ز  لە دۆڵی روباری زرد

**جو** 1027 تا 771پ.ز  لە سەدەی هەشتەمی پ.ز: پوکانەوەی ئیمپراتۆریەت بە هۆی پەرتەوازەیی ئیالاتەکان.

**هان** 220 تا 206 پ.ز: یەکگرتنی ئیمپراتۆر لەگەڵ ناوەندی دۆڵی روباری زەرد

**تانگ**: 618 تا 906ز پایتەختەکەی: چان-ئان و لویانگ

**سونگ**: 960 تا 1279 پایتەختەکەی لە گای فانگ و دواتر لە هانگ جو

**یوان**: 1271 تا 1368 پایتەخت: پەکێن

**مینگ**: 1368 تا 1643 پایتەخت: پەکێن

**چینگ**: 1644 تا 1912 پایتەخت: پەکێن

کۆماری چین 1912 تا 1949

کۆماری گەلی چین لە 1949 تا......

## **فەرهەنگ و نوێکاری**

# نوسین، دارژین یان دەقاڵب گرتن و گۆزەگەری یان گڵ کاری و چەرخی گۆزەگەری

# سەدەی پێنجەمی پ.ز: کۆنفۆسیۆس، لائۆدزۆ، شیعر، گۆزەگەری، یەشم کاریی، وێنەکێشان لەسەر ئاوریشم

# سیستەمی تاقیکردنەوە، مێژوونووسی، شیعر، دروستکردنی دیواری گەورە، کەشفی بومەلەرزە، هاتنی بودایی بۆ ناو چین

# سەردەمی شارنشینی لە لوتکە، پەیدا بوونی شاعیرانی بەناوبانگ، چاپ، دروستکردنی نۆکەندی گەورە

# لوتکەی وێنەکێشان، دەفری چینی رەنگاورەنگ و سادە، کاتژمێری ماشێنی، چاپ بە پیتی توانای گۆڕان، قیبلەنوما

# چین دەبتە بەشێک لە ئیمپراتۆریەتی مەغوڵ، گەیشتنی مارکۆپۆلۆ بۆ چین

# دروستکردنی دەفری چینی بە رەنگی ئاویی و سپی، دروستکردنی شاری ئیمپراتۆری لە پەکێن، دەستپێکی بازرگانی ئەوروپا و مێسیۆنەرەکان بۆ ناو چین

# دروستکردنی دەفری چینی رەنگاورەنگ، هاتنە ناوەوەی ئەوروپییەکان بۆ چین و پوکانەوەی ئیمپراتۆری، پێکهاتنی بزوتنەوەی گەل

# گەشەکردنی بزوتنەوەی خەڵکی و گۆڕانی لە راپەڕین بۆ شۆرش: دروست بوونی گروپ و دەستە، جەنگی ناوخۆیی، جیابوونەوەی کومونیستەکان لە گوئومین تانگ، ڕێپێوانی گەورەی کومونیستەکان، جەنگ لەگەڵ ژاپۆن، سەرکەوتنی کۆمونیستەکان.